




# پرسيار و وەڵامەكانى ميكانيك و هێماكانى چۆنيەتى لێخوڕينى ئۆتۆمبێل

## ٢٠١٧ - ٢٠١٨









# هێمای ڕاست ( ✓ ) لەبەرامبەروەڵامی ڕاست دابنێ



پ1/ ئەوهێمایە ماناکەی:

أ. دەتوانیت بسوڕێیتەوە بۆلای چەپ.

**ب. ناتوانیت بسوڕێیتەوە بۆلای چەپ (قەدەغەیە).** ✓

ج. ئاگاداربە سوڕانەوە بۆ لای چەپ.

پ2/ هەرشوفێرێك ئۆتۆمبیلەكەی بەپێچەوانەی ڕێگا (عكس السیر) لێبخوڕێت سزا دەدرێت بە:

أ. بەندكردن

**ب. پێبژاردن** ✓

ج. بەندكردن و پێبژاردن

پ3/ لەكاتی نزیكبوونەوە لە شوێنی پێچەكانی ڕێگا دەبێت تیژی لێخوڕین كەم بكەیتەوە:

**أ. پێش گەیشتنت بۆ پێچەكان.** ✓

ب. كە چوویتە ناو پێچەكان.

ج. لە كۆتایی پێچەكان.

پ4/ لەكاتی تێكچوون ئۆتۆمبیلەكەت لەسەر ڕێگای خێرا دەبێت سێ گۆشەی فسفۆڕی لەدوای ئۆتۆمبێلەكەت دابنێی دووریەكەی كەمتر لە:

أ. 10 مەتر

ب. 25 مەتر

**ج. 50 مەتر** ✓

پ5/ لێكڕەت بوون (الاجتیاز) لەوكاتانەدا ڕوودەدات:

أ. ئەو كاتەی هێڵی نەپچڕاو لەلای چەپتە.

ب. ئەو كاتەی جووتە هێڵی نەپچڕاو لەلای چەپتە.

**ج. ئەو كاتەی هێڵی پچڕاو لەلای چەپتە.** ✓

پ6/ بەرزترین لێخوڕین لە نزیك قوتابخانە وشەقامە قەرەباڵغەكان:

أ. 40 كم لە كاتژمێرێكدا.

ب. 25 كم لە كاتژمێرێكدا.

**ج. 30 كم لە كاتژمێرێكدا.** ✓



پ7/ ئەوهێمایە ماناكەی

**أ. هەبوونی نەخۆشخانە.** ✓

ب. شوێنی وەستانی ئۆتۆمبێل.

ج. وێستگەی بەنزین.

پ8/ ئەو كاتەی دەتەوێت بپەڕیتەوە لەسەر پردێك

أ. ڕێگات پێ دەدەن بەلێك ڕەتبوون (الاجتیاز).

**ب. ڕێگات پێ نادەن بە لێك ڕەتبوون (الاجتیاز).** ✓

ج. لێخوڕین لەسەرخۆ.

پ9/ كەمترین خێرایی لە ڕێڕەوی ڕاست لە ڕێگای خێرا ڕەوت (سیر السریع) لەناو شاریەكێك لەوانەی خوارەوەیە

أ. 80 كم لە یەك كاتژمێردا.

**ب. 60 كم لە یەك كاتژمێردا.** ✓

ج. 50 كم لە یەك كاتژمێردا.

پ10/ چ شتێك پەیداكەری كارەبا (داینەمۆ) كار پێ دەكات

أ. سلف

**ب. قایش پانكە** ✓

ج. پاتری

پ11/ هەڵوێستت چییە لە ئاگاداركردنەوەی برا شوفێرەكان كاتێك لە شوێنە چێچەكانی ڕێگابوویت بە شەوان

أ. ئامێری ئاگاداركردنەوە بەكاردێنم.

**ب. ڕووناكی بەرز و نزم بەكاردێنم.** ✓

ج. ئۆتۆمبێلەكەم بەخێرایی لێ دەخوڕم.

پ12/ ئەو ئۆتۆمبێلانەی کە تابلۆی پشکنینی کۆمپانیای گشتی (شركة العامة للسيارات)یان بەستووە قەدەغەیە لە ڕێگا بڕۆن پاش تێپەڕبوونی

أ. یەك مانگ ✓

ب. پانزە ڕۆژ

ج. سێ مانگ

پ13/ لە بوونی ناوەند شۆستە (جزرة الوسطية) لە ڕێگا ئەو پیادەی پاش تێپەڕبوونی ئەو شوێنە

أ. پەڕینەوە بەخێرایی

ب. پەڕینەوە بۆ ناوەندە شۆستەکە و چاوەڕێکردن تاکو لایەکی ڕێگای چۆڵ دەبێت ئینجا پەڕینەوەکە تەواو بکەن. ✓

ج. پەڕینەوە لە فراوانترین شوێنی ڕێگاکە.

پ14/ پێشینەی هاتووچۆ بۆ

أ. ئەو ئۆتۆمبێلەی کە لەشەقامی سەرەکییە لەسەر ئەو ئۆتۆمبێلەی کە لە لقە شەقامی (الفرعي). ✓

ب. ئەوەی لە لقە شەقامە لەسەر سەرەکی.

ج. ئۆتۆمبێلی وەستا و لەسەر ئۆتۆمبێلی ڕۆیشتوو.

پ15/ هەندێ کەموکورتی پەیدا دەبێت لە بزوێنەر ئەگەر ئاستی ڕۆن زیاد بێت

أ. گەرمایی بزوێنەر.

ب. دەرچوونی دووکەڵی ڕەش بەزۆری لە گزۆز.

ج. وەستانی (پلاك) لە کارکردن. ✓

پ16/ ئەو هێمایە ماناکەی

أ. پێشبڕکێی هاتووچۆ بۆ تۆیە. ✓

ب. پێشبڕکێی هاتووچۆ بۆ تۆ نییە.

ج. ئاگاداربە لە بوونی ڕێگای دوو ڕێڕەوەی بەرامبەر یەك.

پ17/ خێراترین خێرایی لێخوڕینی ئۆتۆمبیلی بچووك بەشەو لە ڕێگای جووتە ڕێڕەو

أ. 90 کم لە یەك کاتژمێردا. ✓

ب. 80 کم لە یەك کاتژمێردا.

ج. 70 کم لە یەك کاتژمێردا.

پ18/ هەر کەسێك ئۆتۆمبێل خێراتر لێبخوڕێت لە خێرایی دیاریکراو سزادەدرێت بە

أ. پێبژاردن (الغرامة) ✓

ب. بەندکردن

پ19/ ئەو هێمایە مانای چییە؟

أ. ڕێگای دوو ڕێڕەوی بەرامبەر یەك.

ب. لێك ڕەتبوون قەدەغەیە. ✓

ج. وەستا قەدەغەیە.

پ20/ لێخوڕینی ئۆتۆمبیل لە ژێر کارتێکردنی شتی بێ هۆشکەرەوە تاوانێکی هاتووچۆیە و سزاکەشی

أ. بەندکردن بۆ ماوەی (5) ساڵ.

ب. سزادان بەبڕی (150.000) دینار.

ج. بەنکردن بۆ ماوەی کەمتر نەبێت لە (3) مانگ و زیاتر نەبێت لە (6) مانگ یان سزدان بەبڕی (45000) زیاتر نەبێت لە (75000) یان بەهەردوو سزاکان لەگەڵ دەست بەسەر داگرتنی ئۆتۆمبێلەکەی بۆ ماوەی (1) مانگ لەگەڵ کێشانەوەی مۆڵەتی لێخورین بۆماوەی ساڵێك. ✓

پ21/ تیژترین لێخورین لە ڕێگای خێرا ڕەوت (السير السريع)

أ. 90 کم کاتژمێرێکردا.

ب. 120 کم لە کاتژمێرێکدا. ✓

ج. 100 کم لە کاتژمێرێکدا.

?



پ22/ ئەو هێمایەی ماناکەی



أ. وەستان قەدەغەیە.

ب. ئاگاداربە کاری چاککردنەوە لەسەر ڕێگایە. ✓

ج. چوونە ژوورەوە قەدەغەیە.

پ23/ ئەو هێمایە ماناکەی



أ. چوونەژوورەوە قەدەغەیە. ✓

ب. شوێنی وەستانی ئۆتۆمبێل.

ج. شوێنی پەڕینەوەی پیادە.

پ24/ لەکاتی خنکان

أ. نابێت خنکاوەکە لە شوێنی خۆی بجوڵێنرێتەوە.

ب. گفتوگۆ دەکەین لەگەڵ لەگەڵ خنکاوەکە تاکو دڵنیابین.

ج. بۆ هاتنەوەی هەناسەی بەکردار(التنفس صناعي) یارمەتی خنکاوەکە دەدەین. ✓

پ25/ لەکاتی دانەپۆشینی ئۆتۆمبیلە بارهەڵگرەکان بەخێوەت (چادر) لەکاتی لێخوڕینی لەبەرئەوەی تاکو نەکەوتنی بارەکە یان پەرتبوونی بەردی پەرش لەبارەکە سزاکەی

أ. پێبژاردن (الغرامة). ✓

ب. بەندکردن.

پ26/ بەجێهێشتنی ئۆتۆمبیلی بارهەڵگری و کشتوکاڵی و پاسەکان لە کۆڵانەکانی ناوەوە و یان لە شوێنەکانی دانیشتووەکان ئەوکەسانە ناگرێتەوە کە ئۆتۆمبیلەکانی وەستاون بۆ داگرتن و بارکردن سزاکەی

أ. پێبژاردن (الغرامة). ✓

ب. بەندکردن.

پ27/ وەستانی ئۆتۆمبیلەکان لە شوێنی قەردەغەکراوەکان و وەستانی دوو ڕێزویی (بیقاف مزدوج) سزاکەی

أ. پێبژاردن (الغرامة). ✓

ب. بەندکردن.

پ28/ هاتووچۆکردنی ئۆتۆمبیلی بارهەڵگر قەدەغەیە ئەگەر بەرزی زیاتر بێت لەباری دیاریکراو سزاکەی

أ. پێبژاردن (الغرامة). ✓

ب. بەندکردن.

پ29/ ئەو شوفێرەی مۆڵەتی لێخوڕین تازە نەکاتەوە سزا دەدرێت بە

أ. پێبژاردن (الغرامة). ✓

ب. بەندکردن.

ج. پێبژاردن و بەندکردن.

پ30/ لەکاتی ڕوودانی خوێن پژان (النزيف الدموي)

أ. برینداركە وازی لێ دەهێندرێت تاکو خوێنەکەی بەخۆی دەوەستێت.

ب. خوێن پژانەکە ڕادەگرین بەبەستنەوەی شوێنەکەی بەبرین پێچ. ✓

ج. واز لە بریندارەکە دەهێنرێت تاکو دەستە (الاسعاف الفوري) ئامادە دەبێت.

پ31/ ئەو شوفێرەی سوکایەتی وهەڕەشە لە کارمەندی هاتووچۆبکات لەکاتی ئەرك ئەوبەهۆی ئەرکەوە سزا دەدرێت بە

أ. پێبژاردن (الغرامة) لە (1500) دینار تاکو (3000) دینار.

ب. پێبژاردن (الغرامة) لە (7500)دینار تاکو (15000) دینار.

ج. بەندکردن بۆ ماوەیەك کەمترنەبێت لەدوو ساڵ. ✓





پ32/ نابێت پیادە بڕوات لەسەر

أ. ڕێگای خێرا (السير السريع).

ب. لەسەر شۆستە.

ج. شوێنی وەستانی ئۆتۆمبیل.

پ33/ گوێ نەدانە کارمەندی هاتووچۆ یان هێمای ترافیك لایت تاوانێکی هاتووچۆیە سزاکەی

أ. بەندکردن بۆ ماوەیەك پتر نەبێت لەیەك مانگ.

ب. پێبژاردن (الغرامة) کەمتر نەبێت لە (750) دینار و زیاتر نەبێت لە (1500) دینار.

ج. پێبژاردن (الغرامة)

پ34/ دەکرێت لە ئۆتۆمبیلی پێشت ڕەت بیت

أ. ئەو کاتەی هێڵی نەپچڕاو لەلای چەپت.

ب. ئەو کاتەی دوو هێڵی نەپچڕاو لەلای چەپت بێت.

ج. ئەو کاتەی هێڵی پچڕاو لەلای چەپت بێت.



پ35/ ئەوهێمایە ماناکەی

أ. ئاگاداربە قوتابخانەی سەرەتایی لە پێشتە (منداڵان).

ب. شوێنی پەڕینەوەی پیادەت لە پێشە.

ج. قەدەغەیە پەڕینەوەی منداڵان.

پ36/ لێخوڕینی ئۆتۆمبیل وگوێنەدانی لە لێخوڕینەکە سزاکەی

أ. پێبژاردن (الغرامة)

ب. بەندکردن

پ37/ بارکردنی بارلە زیاترلەوەی کە پۆلیسی هاتوچۆ دایناوە (حمولة زائدة) سزاکەی

أ. پێبژاردن (الغرامة)

ب. بەندکردن

پ38/ ئەوهێمایە ماناکەی ئەمەیە

أ. ڕێگا تەسك دەبێتەوە لە هەردوولا

ب. ڕێگا تەسك دەبێتەوە لە هەردوولا چەپ

ج. ڕێگا تەسك دەبێتەوە لە هەردوولا ڕاست



پ39/ ئەوهێمایە ماناکەی ئەمەیە



أ. مەترسی جۆراوجۆر

ب. پێچ بۆلای چەپ

ج. ڕێگا تەسك دەبێتەوە لەلای ڕاست

پ40/ کۆیل هێزوەردەگرێت لە

أ. دابەشکەر (الموزع)

ب. پاتری

ج. پەیداکەر (المولدة)

پ41/ شوفێری ماتۆڕسیکل پێویستە ئەوکەلوپەلانە بەکاربهێنێ لە کاتی لێخوڕینی مۆتۆڕسکیل

أ. پەنجەوانە

ب. کڵاوی سەر

ج. چاویلکەی بەر ڕۆژ

پ42/ پاڵاوتەی هەوا (الشوتە) خاوێن دەکرێتەوە

أ. پاشی (2000) کم

ب. پاش (5000) کم

ج. خاوێن دەکرێتەوە بە گوێرەی بەکارهێنانی ئۆتۆمبێل.

پ43/ ئەگەرشوفێرپێبژاردنی (غرامة) سەرپێچییەکەی نەدا ئەفسەری هاتووچۆ بۆی هەیە دەست بەسەر ئۆتۆمبێلەکەیدا بگرێت بۆ ماوەی

أ. سێ مانگ

ب. دوو مانگ

ج. تا پێبژاردنەکە دەدات.



پ44/ ئۆتۆمبێل قەدەغەیە ڕاوەستێت
أ. لەسەر پرد و تونێل (نفق) ڕێگای پێچ و سوڕانەوە و شۆستە. ✓
ب. تەنیش ڕێگا (الكتف الترابي) لە ڕێگاكانی دەرەوە.
ج. شوێنی وەستانی ئۆتۆمبێل.

پ45/ ئەو كاتەی تایەی ئۆتۆمبێلەكەت دەتەقێ پێو یستە
أ. وەستاندنی ئۆتۆمبێلەكەت بەهۆی ئامێری ژێر پێت.
ب. وەستاندنی ئۆتۆمبێلەكەت لەسەر خۆ بەهۆی ئامێری گۆڕین (جهاز تبدیل). ✓
ج. وەستاندنی ئۆتۆمبێلەكەت بەهۆی ئامێری وەستانی دەست.

پ46/ هەر ئۆتۆمبێلێك دەبێت ڕۆنی بزوێنەر بگۆڕێت لە
أ. 1000 كم ✓
ب. 500 كم
ج. هەموو هەفتەیەك

پ47/ ئەگەر شوفێر ئۆتۆمبیلەكەی لە شوێنێك ڕاگرت كە وەستانی تێدا قەدەغە بێت یان دژی ڕێگا لێخوڕی. ئەفسەری هاتووچۆ دەسەڵاتی هەیە دەست بەسەر ئۆتۆمبێلەكەیدا بگرێت بۆ ماوەیەك كە پتر نەبێت لە
أ. 10 ڕۆژ ✓
ب. 20 ڕۆژ
ج. 30 ڕۆژ

پ48/ ئەگەر هاتوو پەیداكەرەی كارەبا (داینمو) زیاد شەحنی كرد پێویستە شوفێر
أ. لابردنی سەرە پاتری.
ب. ئیش پێكردنی هەموو بەشە كارەباییەكان. ✓
ج. لابردنی یان جیاكردنەوەی قایشی پانكە.



پ49/ بەكارهێنانی شوشەی تاریك لە جامەكانی ئۆتۆمبیل سزاكەی
أ. پێبژاردن (الغرامة) ✓
ب. بەندكردن

پ50/ بەكارنەهێنانی پشت بەندی دڵنیایی (حزام الامان) لەو ئۆتۆمبێلانەی كە هەیانە لە ڕێگای دەرەوە سزاكەی
أ. پێبژاردن (الغرامة) ✓
ب. بەندكردن

پ51/ ئەو هێمایە ماناكەی



أ. سوڕانەوە قەدەغەیە.
ب. بەم ڕێگایە بڕۆ. ✓
ج. ئاگادار بەگۆڕەپانی سوڕانەوە لەپێیە.

پ52/ ئەو هێمایە ماناكەی



أ. بەكارهێنانی ئامێری ئاگاداركردنەوەی قەدەغە. ✓
ب. چاوەڕوانكردن قەدەغەیە.
ج. هەبوونی نەخۆشخانە.

پ53/ خێراترین خێرایی لێخوڕینی لەناو شار
أ. 70 كم
ب. 60 كم ✓
ج. 50 كم

پ54/ لەكاتی ڕوودانی كارەساتی مل لێنان (دهس) كە دەبێتە هۆی بریندار بوونی كەسێك پێویستە شوفێرەكە
أ. بریندارەكە بگوازێتەوە بۆ نزیكترین بنكەی تەندروستی یان نەخۆشخانە. ✓
ب. دەبێت شوفێرەكە بۆ خۆی هەوڵی چارەسەری بریندارەكە بكات.
ج. گواستنەوەی بریندارەكە بۆ لای پزیشكێك كە ناسیاوی شوفێرەكە.



پ55/ ئەم هێمایە ماناکەی




أ. وەستان قەدەغەیە

**ب. هاتووچۆکردنی ئۆتۆمبێلی بارهەڵگر بەرزی زیاترە لە (3.5) مەتر قەدەغەیە.** ✓

ج. هاتووچۆکردنی ئۆتۆمبێلی بارهەڵگر قەدەغەیە.

پ56/ ئەم هێمایە ماناکەی



**أ. هاتووچۆی پاسکیل قەدەغەیە.** ✓

ب. هاتووچۆی پاسکیل قەدەغە نییە.

ج. شوێنی پەڕینەوەی پایسكل.

پ57/ دانانی جوانکاری وئاگادارکراوەکان ونووسینەوە ووێنە لە ئۆتۆمبێلکەت یان شوشەی جامی پێشەوە و دواوە سزاکەی

**أ. پێبژاردن (الغرامة)** ✓

ب. بەندکردن

پ58/ لەکاتی تێکچوونی وەستێنەر (اسطاب) لەناکاو پێویستە لەسەر شوفێر

أ. گۆڕینی خێرایی نز بۆ خێرایی بەرز بەهۆی (گێڕ).

**ب. گۆڕینی خێرایی بەرز بۆ خێرایی نزم بەهۆی (گێڕ).** ✓

ج. بەکارهێنانی وەستێنەری دەستی (هاندبرێك).

پ59/ زنجیر کانزایی دەبەسترێت بۆ ئۆتۆمبێل لەتایەکانی

أ. لەکاتی بەستان لە شوێنە ئاساییەکان بۆ نەخزینی ئۆتۆمبێل.

ب. بۆ سەرکەوتن بۆ بەرزایی.

**ج. لە شوێنە شاخاوییەکانی بۆ نەخزینی ئۆتۆمبێل.** ✓

پ60/ لە سوودەکانی (جیاکەرەو) کلاچ ئەمەیە

**أ. جیاکردنەوە و دانەوەی جووڵەی بزوێنەرەوە بۆ گێڕ.** ✓

ب. بۆ وەستانی بزوێنەر.

ج. بۆ زیاکردنی خێرایی.

پ61/ لەکاتی بەکارهێنانی ئامێری مۆبایل پێویستە

أ. بەکارهێنانی لەکاتی ڕاوەستانی ئۆتۆمبێلەکەت لە ترافیك لایت.

ب. بەکارهێنانی لەکاتی لێخوڕین بۆ ئەوە تاکو قەرەباڵغی ڕوونەدات لەڕێگا.

**ج. وەستاندنی ئۆتۆمبێلەکەت لە شوێنی قەدەغە نەکراوەکان و لە شوێنی تایبەت تاکو پەیوەندییەکەت تەواو دەبێت.** ✓

پ62/ کەمترین خێرایی لەڕێگای خێرا (السیر السریع) ئەمەیە

أ. 100 کم لە یەك کاتژمێردا.

**ب. 60 کم لە یەك کاتژمێردا.** ✓

ج. 80 کم لە یەك کاتژمێردا.

پ63/ کێ باشترین هاوڕێتە (برادەرتە) لەکاتی لێخوڕینی ئۆتۆمبێلەکەت

أ. ئامێری مۆبایل.

ب. ئەو کەسەی لە ئۆتۆمبێلەکەت دانیشتووە قسەت لەگەڵ دەکات.

**ج. هێماکانی هاتووچۆ باشترین هاوڕێتن.** ✓



**پ64/ لەکاتی ڕۆن گۆڕیندا پێویستە**

أ. تەنها گۆڕینی ڕۆن.

ب. گۆڕینی ڕۆن و پشکنینی هەوای تایەکان.

ج. گۆڕینی ڕۆن و پشکنینی ڕۆنی گێڕ و ئەکسل. ✓

**پ65/ لەکاتی ونبوونی تابلۆی تۆمارکردنی ئۆتۆمبێل سزاکەی**

أ. پێبژاردن (الغرامة) ✓

ب. بەندکردن

**پ66/ یەکێك لە هۆیەکانی کەمکردنی ئاوی ڕادیتەر بەبێ ئەوەی لێیچوو بێت**

أ. گیرانی ڕادیتەر.

ب. تێکچوونی ترامپۆی ئاو (واتەر پەمپ).

ج. وشکبوونی کاسکێت یان خواربوونی کەوەر. ✓

**پ67/ یەکێك لە هۆیەکانی لێدانی بزوێنەر لەکاتی لێخوڕین**

أ. عەیار نەدانی دابەشکەرەوەی ئاگر (دیلکۆ) بەشێوەیەکی ڕاست لەگەڵ کەموکورتی لە بەنزینی خراپ. ✓

ب. پەیدابوونی شکست لە تێکەڵکەرەوەی (کابریتر).

ج. کەمبوونی ڕۆن لە بزوێنەر.

**پ68/ ئیشپێکەری خۆیی (سلف) هێزی پێویست بۆ کاکردن وەردەگرێت لە**

أ. پاتری ✓

ب. پەیداکەری کارەبا (دینەمۆ).

ج. کەمەربەندی پانکە.

**پ69/ گواستنەوەی نەفەرلەسەرلاتەنیشتی ئۆتۆمبێل یان سەربەشێکی دەرەوەی ئۆتۆمبێل سزاکەی**

أ. دەستگیرکردنی شۆفێر.

ب. دەست بەسەرداگرتنی ئۆتۆمبێل.

ج. سزدانی پێبژاردن (الغرامة). ✓

**پ70/ سوڕانەوەی ئۆتۆمبێل لە شوێنی قەدەغەیە سزاکەی**

أ. پێبژاردن (الغرامة). ✓

ب. بەندکردن.

**پ71/ نابێت ئاستی ئۆتۆمبێل پتر بێت لە پێشی ئۆتۆمبێلەکە و دواوەی**

أ. یەك مەتر.

ب. دوو مەتر.

ج. نیو مەتر. ✓

**پ72/ ئەگەر ئۆتۆمبێلی دواوەت ئاگاداری کردیەوە دەیەوێت لە ئۆتۆمبێلەکەت ڕەت بێت پێویستە لەسەرت**

أ. لای دەستە ڕاست بگریت و خێرایی ئۆتۆمبێلەکەت زیاتر نەکەیت. ✓

ب. خێرایی ئۆتۆمبێلەکەت زیاد بکە تاکو بزانی تۆ ناتەوێت لە ئۆتۆمبێلەکەت ڕەت بێت.

ج. ڕێگای پێ بدەی لەلای ڕاست و چەپت بەئارەزووی خۆی ڕەت بێت.

**پ73/ ئەگەر دەرکەوت تایەکانی پێشەوەی ئۆتۆمبێلەکەت زوو خراپ دەبێت بەشێوەیەکی نائاسایی هۆیەکەی**

أ. تۆ باری کەمتر لە ئۆتۆبیلەکەت بار دەکەیت.

ب. تۆ پێویستە کۆمەڵەی پێشەوەی ئۆتۆمبێلەکەت بەفیتەر پیشان بدەیت. ✓

ج. تۆ ئۆتۆمبێلەکەت بەشێوەیەکی نارێك بەکاردەهێنیت.

**پ74/ دابەشکەرەوەی ئاگر (دیلکۆ) هێزی بەرز وەردەگرێت لە**

أ. کۆیل ✓

ب. پلاك

ج. پێداکەری کارەبا (دینەمۆ).



پ75/ ئەم هێمایە مانای



أ. هاتووچۆی ئۆتۆمبێلی تانکەری قەدەغەیە.

ب. هاتووچۆی ئۆتۆمبێلی بارهەڵگر قەدەغەیە.

ج. ڕێگای خلیسك (زلق) ✓

پ76/ ئەو شوفێرەی ڕێز لە مافی پیادە ناگرێت بۆ پەڕینەوەی لە شوێنی دیاریکراو بۆ پەڕینەوە سزادەدرێت بە

أ. پێبژاردن بەبڕێك کەمتر نەبێت لە (3000) دینار و زیاتر نەبێت لە (7500) دینار.

ب. بەندکردنی بۆ ماوەیەك کەمتر نەبێت لە یەك مانگ و زیاتر نەبێت لە (3) مانگ.

ج. پێبژاردن بە بڕێك پارەکە کەمتر نەبێت لە (1500) دینار و زیاتر نەبێت لە (4500) دینار لەگەڵ دەست بەسەرداگرتنی ئۆتۆمبێلەکەی بۆ ماوەیەك کەمتر نەبێت لە هەفتەیەك و زیاتر نەبێت لە دوو هەفتە. ✓

پ77/ ئەرکی ڕێکخەری (کتاوت) چییە؟

أ. تەزووی کارەبا ڕێکدەخات لە بەینی دینەمۆ پاتری. ✓

ب. تەزووی کارەبا ڕێکدەخات لە بەینی پلاك و دابەشکەرەوە (دیلکۆ).

ج. تەزووی کارەبا ڕێکدەخات لە بەینی سلف و پاتری.

پ78/ ئەوهێمایەی ماناکەی



أ. هاتووچۆی ئۆتۆمبێلی بارهەڵگر قەدەغەیە.

ب. هاتووچۆی ئۆتۆمبێلی بارهەڵگر کە عارەبانەی بەدواوە بێت قەدەغەیە. ✓

ج. ڕاوەستان قەدەغەیە.

پ79/ لەکاتی شکانی ڕینگی پەستێنەر (ڕینگی پستن) دەبێتە هۆی

أ. پەیدابوونی دووکەڵی شینی بەردەوام لە سالێنسە. ✓

ب. پەیدابوونی دووکەڵی سپی لە سالێنسە.

ج. پەیدابوونی دووکەڵی ڕەش لە سالێنسە.

پ80/ ڕاگرتنی ئۆتۆمبێلەکەت لەسەر شۆستە سزاکەی

أ. پێبژاردن (الغرامة) ✓

ب. بەندکردن.

پ81/ بەکارنەهێنانی شلەی دژە بەستن (انتي فريز)

أ. بەکاردێت بۆ بەستانی ڕۆنی بزوێنەر لە زستاندا.

ب. بەکاردێت بۆ نەبەستانی ئاوی ڕادێتەر لە زستاندا. ✓

ج. بەکاردێت بۆ نەبەستانی ڕۆنی ڕاگر (برێك) لە زستاندا.

پ82/ ئەوهێمایە ماناکەی




أ. نەخۆشخانە

ب. گۆڕەپانی ڕاگرتنی ئۆتۆمبێل (گەراج). ✓

ج. دەرمانخانە

پ83/ لەکاتی کوڵانی ئاوی ڕادێتەر پێویستە شوفێر

أ. ڕاگرتنی ئۆتۆمبێل و کردنەوەی سەری ڕادێتەر و تێکردنی ئاو.

ب. کوژاندنەوەی بزوێنەر و تێکردنی ئاو لە ڕادێتەر.

ج. نا بێت بزوێنەر بکوژێندرێتەوە، سارد بکرێتەوە ئینجا قەپاغی سەری ڕادێتەر دەکەیتەوە و ئاوی تێدەکەیت. ✓

پ84/ ئایا ترومپای ڕۆن دروستکراوە بۆ

أ. سوڕانی ڕۆن. ✓

ب. کێشانی بەنزین.

ج. ساردکردنەوەی ڕۆن.





پ85/ ئەوەی مۆڵەتی لێخوڕینی گشتی هەبێت بۆی هەیە
أ. ئۆتۆمبێلی تایبەتی وگشتی و بارهەڵگر لێبخوڕێت. ✓
ب. تەنها ئۆتۆمبێلی گشتی لێبخوڕێت.
ج. هەموو جۆرە ئۆتۆمبێلێك لەگەڵ ئامێری كشتوكاڵی و بیناسازیدا.

پ86/ كەی ڕۆنی برێك دەگۆڕیت
أ. لە 3000 كم
ب. لە 5000 كم
ج. نایگۆڕین تەنها ڕۆنی زیاد دەكەین ئەگەر ئاستی ڕۆنەكە كەمی كرد. ✓

پ87/ ئامێری ئاگاداركردنەوە (هۆرن) قەدەغەیە بەكاربهێنرێت لە نزیك
أ. قوتابخانەكان
ب. نەخۆشخانەكان
ج. لەهەموو شوێنێك تەنها ئەگەر بەكارهێنانی زۆر پێویست بێت. ✓

پ88/ ئەو هۆیانە كار دەكەن سەر فەوتانی تایەی ئۆتۆمبێل
أ. لێخوڕینی خێرا. ✓
ب. لێخوڕینی لەسەرخۆ.
ج. نزمبوونی پلەی گەرما.

پ89/ ژمارەی تەلەفۆنی فریاكەوتن
أ. 102
ب. 104 ✓
ج. 122



پ90/ ئەوهێمایە ماناكەی
أ. بنكەی چاككردنەوەی ئۆتۆمبێل لەسەر ڕێگا.
ب. سووڕانەوە قەدەغەیە.
ج. ترومپای بەنزیك لەسەر ڕێگا. ✓

پ91/ ئەوهێمایە ماناكەی
أ. ڕێگای تایبەت بۆ پەڕینەوەی پیادە.
ب. هاتووچۆ قەدەغەیە.
ج. مەترسی جۆراوجۆر (مەترسی ترسناك). ✓

پ92/ یاسای هاتوچۆ كە ئێستا كاری پێدەكرێت ئەو یاسایە ژمارەكەی
أ. ژمارە (48) ساڵی 1968 ڕاستكراوە.
ب. ژمارە (48) ساڵی 1971 ڕاستكراوە. ✓
ج. ژمارە (48) ساڵی 1948 ڕاستكراوە.

پ93/ چارەسەری سووتاو دەكرێت بە
أ. دانانی مەرهەم لەسەر شوێنی سووتان.
ب. پۆشینی شوێنی سووتاو وگەیاندنی بۆ نەخۆشخانە. ✓
ج. دانانی جلو بەرگی سووتاوەكە بەخێرایی.

پ94/ ئەوهێمایە ماناكەی
أ. ئاگاداربە لە پێشت دوو ڕێگا ڕاڕەو هەیە.
ب. ئاگاداربە ڕێگاكە داخراوە.
ج. وەستان قەدەغەیە. ✓

پ95/ ئەگەر كەشوهەوا باراناوی بوو وڕێگا خلیسكاوی بوو پێویستە شوفێر
أ. لێخوڕین بەخێرایی لەگەڵ چاودێری ڕێگا.
ب. لێخوڕین لەسەرخۆ لەگەڵ چاودێری ڕێگا. ✓
ج. بەكارهێنانی برێك بەهێز.



پ96/ نابێت پیادە بڕوات لە
أ. ڕێگای خێرا (السير السريع). ✓
ب. لەسەر شووستە.
ج. شوێنی وەستانی ئۆتۆمبێل.

پ97/ برینداربەمردوو دەژمێردرێت کە
أ. هەناسە وەستا
ب. دڵی وەستا
ج. دکتۆر دانی نا بەمردنی ✓

پ98/ ئەگەر ئۆتۆمبێلەکەت بەخێرایی 90 کم لە کاتژمێرێکدا لێبخوڕیت پێویستە ماوەی نێوان ئۆتۆمبێلەکەت و ئۆتۆمبێلی پێشەوەت
أ. 70 مەتر
ب. 40 مەتر
ج. 90 مەتر ✓

پ99/ دوو هێڵی نەپچڕاو بەڕەنگی زەرد بۆیەکراو لەدەستە ڕاستی ڕێگا بێت ماناکەی
أ. وەستان قەدەغەیە لەڕۆژانی کارکردن.
ب. وەستان قەدەغەیە لە هەموو کاتێکدا. ✓
ج. وەستان قەدەغەیە.

پ100/ ئەگەر ئۆتۆمبێلەکەت لە کەشوهەوایەکی تەمومژدا لێخوڕی باشتر وایە
أ. لایتی نزم دابگیرسێنی.
ب. لایتی بەرز دابگیرسێنی. ✓
ج. بەبێ لایت بڕۆیت.

پ101/ پلەی سەرکەوتن لە تاقیکردنەوەی مۆڵەت پێدان
أ. 60%
ب. 75% ✓
ج. 80%

پ102/ لە هۆیەکانی بەرزبوونەوەی پلەی گەرمی بزوێنەر
أ. کەمبوونی ئاولە ڕادێتەر. ✓
ب. کەمبوونی ڕۆن لە بزوێنەر.
ج. کەمبوونی ڕۆنی وەستێنەر (برێك)

پ103/ هۆیەکانی هەڵچوونی کوڵانی ئاوی پاتری (تێزاب) ئەمەیە
أ. تێکچوونی دینەمۆ (پەیداکەری کارەبا).
ب. تێکچوون و پچڕانی قایشی پانکە.
ج. تێکچوونی کەتاوت (ڕێکخەری تەزووی کارەبا). ✓

پ104/ لێخوڕینی ئۆتۆمبێل ئەگەر هاتوو مەرجەکانی توندی و دڵنیایی (المتانة و الامان) و نەبوونی گڵۆپی ڕووناکی و پێشەوە و دواوە سزاکەی
أ. پێبژاردن (الغرامة). ✓
ب. بەندکردن.

پ105/ خێراترین خێرایی لێخوڕین لەناو شار
أ. 70 کم
ب. 60 کم ✓
ج. 50 کم